زنجیرە ڕێنماییەکانی دێرین

ژمارە
٨٣

ژمارەی مۆڵەت ١

پەرتوکخانەی دێرین

# مـــانـــای ووشـــەکـــانی

# نـــوێـــژ

مانای

* تەکبیرەی دەست پێکردنی نوێژ
* دوعای دەستپێکردنی نوێژ
* ئایەتەکانی سورەتی فاتیحە
* زیکری چەمینەوە
* زیکری هەستانەوە لە رکوع
* زیکری سوجدە بردن
* دوعای نێوان هەردوو سوجدە
* تەحیات
* صەلاوات دان
* دوعای دوای تەحیات
* سەلام دانەوە

نوسین و ئامادەکردنی

م. هەڵگورد مصطفی گەلاڵەیی

لە بلاوکراوە خێریەکانی پەرتوکخانەی دێرین - سۆران

٠٧٥٠٤١٢٨٢٢٠

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على نبينا محمد وعلى آله وصحبهو من تبعهم بإحسان إلى يوم الدين و بعد .

## (( تەكبيرەی دەست پێكردنی نوێژ ))

ماناى ( اللّهُ أَكْبَرُ ) واتە: خواى لە هەموو شتێك گەورەترە لە زات و ناو و سيفاتە جوان و بەرزەكانی .

## (( مانای دوعای دەست پێكردنی نوێژ ))

﴿وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفًا وما أنا من الْمُشْرِكِينَ، إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لَا شَرِيكَ له وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وأنا من الْمُسْلِمِينَ ﴾ . واتە: ڕوومكردە ئەو خوایەی كە ئاسمانەكان و زەوی دروست كردووە , پشتم كرد لە هەموو هاوەڵ بۆ دانانێك بۆ خوای گەورە و ڕووم تەنها لە تەوحید و تەنها خوا پەرستی كرد، من لەو كەسانە نیم كە شەریك بۆ خوا دادەنێن ، بەڕاستی نوێژكردنم و قوربانی كردن و ژیانم و مردنم هەمووی بۆ ئەو خوایەیە كە پەروەردگاری هەموو جیهانیانە و هیچ هاوەڵێكی نیە، ئا بەم شێوەیە فەرمانم پێكراوە خوا بپەرستم و من یەكێكم لە موسوڵمانان .

مانای: ﴿أَعُوذُ بالله من الشيطان الرجيم﴾. واتە: پەنا دەگرم بەخوا لە شەیتانی نەفرەت لێ كراو .

مانای : ﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴾ . واتە: بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان .

## (( مانای ئایەتەكانی سورەتی ( فاتیحە ) ))

( الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ) . واتە: هەموو سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان .

( الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ) . واتە : بەخشندەی میهرەبان .

( مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ ) . واتە : خاوەنی ڕۆژی سزاو پاداشت دانەوە .

( إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ) . واتە : خوایە تەنها تۆ دەپەرستین و تەنها داوای یارمەتی لەتۆ دەكەین .

( اهدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ) . واته : ڕێنموونیمان بکه بۆ ڕێگای ڕاست .

( صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ ) . واته : ڕێگای ئەوانەی کە نازو نیعمەت و بەخششی خۆتت بەسەردا ڕشتون – له پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان – نەك ڕێی ئەوانەی کە خەشم و قینی تۆیان بەسەر دا ڕژا وەك ( یەهودیەکان )، وە نەك ڕێی ئەوانەی کە گومڕاو سەر لێشێواو بوون وەك ( گاورەکان ) .

( آمين ) . واته : خوایە دوعاکانمان قەبوڵ بکەو وەلاّممان بدەوە .

(( مانای زیکری چەمینەوە ( ڕوکوع ) ))

﴿ سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ ﴾ واته : پاکی و بێگەردی بۆ پەروەردگاری گەورەو مەزنم .

(( مانای زیکری ڕاست بوونەوەو هەستانەوە لە ڕوکوع ))

﴿ سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، قَالَ رَجُلٌ وَرَاءَهُ: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ ﴾ . واته : خوا نزاو ستایشی ئەو کەسەی بیست و وەریگرت کە سوپاس و ستایشی کرد , پەروەردگارمان هەموو سوپاس و ستایشێك هەر بۆ تۆیە .

(( مانای زیکری سوجدە بردن ))

﴿سُبْحَانَ رَبِّيَ الأعْلَى﴾ . واته : پاکی و بێگەردی بۆ پەروەردگاری بەرز و بڵند .

(( مانای دوعای دانیشتنی نێوان هەردوو سوجدە ))

﴿ رَبِّ اغْفِرْ لِي رَبِّ اغْفِرْ لِي ﴾. واته : پەروەردگارم لێم خۆش ببە ، پەروەردگارم لێم خۆش ببە .

(( مانای – تەحیات – ))

﴿ التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ السَّلَامُ عَلَى النَّبِيِّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ﴾ . واته : سەلام و گەورەیی و پاك و بێ گەردی و داواکردن و کردەوەی پاك و چاك هەر بۆ خوایە، سڵاّو و ڕەحمەت و بەرەکەتی خوا لەسەر پێغەمبەری خوا بێت ﷺ، وە سڵاّو لەسەر ئێمە و بەندە چاکەکانی خوا بێت، شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك شایستەی پەرستن نیە جگە لە ( الله ) شایەتیش دەدەم کە محمد ﷺ بەندە و نێردراوی خوایە .

## (( ماناى سەڵەوات دان لەسەر پێغەمبەرى خوا ﷺ ))

﴿ اللَّهُمَّ صلِّ عَلى مُحَمَّد ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّد ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ ، وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ ، إِنَّك حَمِيدٌ مَجِيدٌ ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ ، وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ ﴾ واتە: درودو سەڵەوات برژێنە بەسەر محمد و خانەوادەى محمد ، هەروەكو چۆن درودت ڕژاند بەسەر ئیبراهیم و خانەوادەى ئیبراهیمدا ، بەڕاستى تۆ سوپاس و ستایش كراویت و خاوەن شكۆیت ، خوایە پیرۆزى برژێنە بەسەر محمد و خانەوادەى محمد دا هەروەكو چۆن پیرۆزیت ڕژاند بەسەر ئیبراهیم و خانەوادەى ئیبراهیمدا، بەڕاستى تۆ سوپاس و ستایش كراویت و خاوەن گەورەیى و شكۆیت .

## (( ماناى دوعاى دواى تەحیات ))

﴿ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ ، وَمِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ ، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ ﴾ . واتە: خوایە پەنات پێ دەگرم لە سزاى دۆزەخ و سزاى ناو گۆڕ و ئاشوبەى ژیان و ئاشوبەى مردن و خراپەى ئاشوبەى مەسیحى دەججال .

## (( ماناى سەلامدانەوەى نوێژ ))

لە سەلام دانەوەى لاى ڕاستدا دەڵێى : ﴿ السَّلامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ ﴾ . واتە : سەلام و ڕەحمەت و بەرەكەتى خواى گەورەتان لەسەر بێت، وە دەتوانى لە سەلام دانەوەى لاى ڕاست و چەپدا بڵێى : ﴿ السَّلامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ ﴾ . واتە : سەلام و ڕەحمەتى خواى گەورەتان لەسەر بێت .

وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه وسلم

٢٨ / ذوالقعدة / ١٤٣٧ ﻫ - ٣١ / ٨ / ٢٠١٦ م

لە بڵاوكراوەكانى پەرتوكخانەى دێرین سۆران - ٠٧٥٠٤١٢٨٢٢٠